بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## دوعا خەتما قورئانێ

الْحَمْدُ لِلَّهِ ربِّ الْعَالَمِينَ، اللّهُمَّ يا رِبِّ لك الْحَمْدُ كما يَنْبَغِي لِجَلَالِ وَجْهِكَ وَلِعَظِيمِ سُلْطَانِكَ، اللّهُمَّ صَلِّ على مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كما صَلَّيْتَ على إبراهيم وَعَلَى آلِ إبراهيم إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللهم بَارِكْ على مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كما بَارَكْتَ على إبراهيم وَعَلَى آلِ إبراهيم إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ.

- **خودێوۆ ئەز ب هەمی ناڤێت تە، ئەوێت تە خۆ پێ ناڤکری، داخوازێ ژ تە دکەم یان ئەو ناڤێت تە نیشا بەندەیەکی ژ بەندەیێت خۆ دایین، یان ئەوێت تە د کتێبەکێ ژ کتێبێت خۆدا ئینایینە خوار یان ئەوێت تە ل دەڤ خۆ د علمێ غەیبێدا هێلایین و نیشا کەسێ نەدایین تو قورئانێ بکەیە بهارا دلێ من و ڕۆناهییا چاڤێت من، و کول و کۆڤانێت من پێ ڤەڕەڤینی و نەهێلی.**
- **خودێوۆ هیڤی دکەم تو خواندنا قورئانا خۆ هەمی وەختان ب ڕزقێ من بکەی، و من بکەیە دویکەڤتی و ئەهلێ قورئانێ، و ڕۆژا قیامەتێ ڤێ قورئانێ بۆ من بکەیە مەهدەر و بەرەڤان.**
- **خودێوۆ یا من ژ بیرکری بینە بیرا من، و یا من نەزانی نیشا من بدە، و من بکە قورئانخوینێ شەڤ و ڕۆژان.**
- **خودێوۆ ئەز داخوازا لێبۆرینێ و سلامەتییێ بۆ دین و دنیایێ و مالدارییا خۆ ژ تە دخوازم، خودێوۆ کێماسییێت من ڤەشێرە و ترسا من ڕاکە و نەهێلە، و من ژ هەمی ڕەخانڤە بپارێزە.**
- **خودێوۆ سلامەتییێ د لەشێ مندا بدە من، و سلامەتییێ د چاڤێت مندا بدە من، و سلامەتییێ د گوهێت مندا بدە من، خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ گاوری و هەژارییێ و ئیزایا گۆڕی، هەر تویی خودان، ژ بلی تە چو خودێ و خودان نینن تو نەبی.**
- **خودێوۆ تو خودانێ منی ژ بلی تە چو خودان نینن، تە ئەز یێ چێکریم و ئەز بەندەیێ تەمە، و ئەز یێ ل سەر وێ سۆز و پەیمانا تە ژ مە وەرگرتی هندی ئەز بشێم، ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابیا من کری، و ئەز کەرەمێت تە ل سەر خۆ ئاشکەرا دکەم و دهەڤینم، و ئەز دانپێدانێ ب گونەهێت خۆ ژی دکەم، ڤێجا گونەهێت من ژێ ببە، ب ڕاستی کەس گونەهان ژێ نابەت تو نەبی.**
- **خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ نەچارییێ و بێخێرییێ و ژ قەلسی و ترسنۆکیێ، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ دەینداری و بندەستییێ، و ئەز داخوازا باشیا دنیایێ و ئاخرەتێ ژ تە دکەم هەی دلۆڤانێ ژ هەمی دلۆڤانان دلۆڤانتر.**
- **خودێوۆ ئەز داخوازا ڕازیبوونێ ژ تە دکەم پشتی هەر قەزایەکا تو د دەرهەقێ مندا دکەی و داخوازا ژیانەکا خۆش پشتی مرنێ ژ تە دکەم، و داخوازا حەژێکرنا ڕاوەستیانا ل بەر دەستێت تە و خۆشیا دیتنا تە ژ تە دکەم، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ زۆردارییێ، چ ئەز بکەم، و چ ل من بێتەکرن، یان**

تەعدایی ل من بێتەكرن، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ وێ خەلەتی و گونەها بكەم، یا تو ژێ نەبەی و لێ نەبۆری.

- ❖ خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ پیراتیێ، خودێوۆ بەرێ من بدە باشترین كار و كریار و سنجان، ب ڕاستی كەس بەرێ مرۆڤی نادەتە كار و ڕەوشتێ باش تو نەبی، و خودێوۆ كار و ئەخلاقێ خراب ژ من بدە پاش، ب ڕاستی كەس نینە وان ژ من بدەتە پاش تو نەبی.
- ❖ هەی ئەوێ هەر ساخ و ڕێبەرێ هەمی كاروباران، هەمی كاروبارێت من ڕاست و دورست بكە و چاڤهەلاندن و دانانەكێ ژی من نەهێلە ب هیڤییا منڤە.
- ❖ خودێوۆ دینێ من بۆ من بهێلە كو ژ دەست من نەچیت، و خانییێ من بۆ من بەرفرەه بكە، و بەرەكەتێ بێخە ڕزقێ من، خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ دلڕەقییێ و بێ ئاگەهیێ، و ژ ڕەزیلی و بێچارەییێ و ژ هەژارییێ، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ گاوری و ژ ڕێدەركەڤتنێ، و ژ خۆمەزنكرن و ڕویمەتیێ.
- ❖ و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ كەڕاتی و لالی و خلتەییێ، و ژ هەمی ئێشێت پیس.
- ❖ خودێوۆ.. خودێ ترسییێ نیشا نەفسا من بدە و پاقژ بكە، تو ژ هەمییان چێتری پاقژ بكەی، تو سەمیان و خودانێ وێیی.
- ❖ خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ هەر زانینەكا مفایی نەدەت، و ژ هەر دلەكێ نەترسیت و ژ هەر نەفسەكا تێر نەبیت، و ژ هەر دوعایەكا نەئێتە قەبویلكرن.
- ❖ خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابیا كارێ من كری و ژ خرابیا كارێ هێژ من نەكری، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابیا من زانی و ژ خرابیا هێژ من نەزانی.
- ❖ خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ نەمانا كەرەمێت تە و ژ نەمانا سلامەتیا تە، و ژ هاتنا ئیزایا تە یا ژ نشكەكێڤە دئێت، و ژ هەمی كەربا تە.
- ❖ خودێوۆ دینێ من بۆ من ڕاست و دورست بكە ئەوێ پاراستنا من تێدا، و دنیا من بۆ من خۆش بكە ئەوا ژیارا من تێدا، و ئاخرەتا من باش بكە ئەوا ڤەگەڕیانا من تێدا، و ژیانێ بۆ من بكە ئەگەرێ هندێ هەمی خێر ل من زێدە ببن، و مرنێ بۆ من بكە ڕەحەتی ژ هەمی خرابییان.
- ❖ خودێوۆ هاریكارییا من بكە و هاریكارییێ ل سەر من نەكە، و من سەربێخە و كەسێ ب سەر من نەئێخە، و بەرێ من بدە ڕێكا ڕاست و ڕێكا ڕاست بۆ من ب ساناهی بێخە.
- ❖ خودێوۆ من بكە زێدە زكركەر بۆ خۆ، و زێدە شوكوردار بۆ خۆ، و زێدە گوهدار بۆ خۆ.
- ❖ خودێوۆ تۆبەیا من قەبویل بكە و گونەهێت من بشۆ و دوعایێت من قەبویل بكە، و ئەزمانێ من ڕابگرە و دلێ من ڕۆن بكە، و ئەزمانێ من ڕاست بكە و كەرب و كینا سینگێ من دەربێخە.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا دلەکێ پاقژ و ئەزمانەکێ ڕاست ژ تە دکەم، و ئەز داخوازا وێ خێرێ ژ تە دکەم یا تو دزانی، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ وێ خرابییێ یا تو دزانی، و ئەز داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ تە دکەم ژ وێ یا تو دزانی، و هەر تویی زانایێ غەیبێ.

❖ خودێوۆ من ڕاستەڕێ بکە، و من ژ خرابیا نەفسا من بپارێزە.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا کرنا خێران و هێلانا خرابییان و حەژێکرنا فەلەندەران ژ تە دکەم، و ئەز داخوازێ ژ تە دکەم تو گونەهێت من ژێ ببەی و دلۆڤانییێ ب من ببەی، و ئەگەر تە ڤیا بەندەیێت خۆ بجەڕبینی من نەسەرداچۆیی بکێشە دەڤ خۆ.

❖ خودێوۆ ئەز حەژێکرنا تە و حەژێکرنا وی یێ حەژ تە بکەت، و حەژێکرنا هەمی کار و کریارێت من نێزیکی حەژێکرنا تە بکەن ژ تە دخوازم.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا باشترین دوعایێ ژ تە دکەم و باشترین سەرکەڤتن و باشترین خێر، و من موکوم بکە و ترازیا من گران بکە، و باوەرییا من موکوم و بنەجهـ بکە، و پلەیێت من بلند بکە و نڤێژێت من قەبویل بکە، و ل گونەهێت من ببۆرە و ئەز داخوازا دەرەجەیێت بلند د بەحشتێدا ژ تە دکەم.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا دەرگەهێت خێرێ، یێت سەری و ژ هەمیا بلندتر ، ژ تە دکەم، یێت ئاشکەرا و نەئاشکەرا. خودێوۆ ئەز داخوازێ ژ تە دکەم ناڤێ من بلند بکەی و دلێ من پاقژ بکەی، و دەهمەن و نامویسا من بپارێزی و گونەهێت من ژێ ببەی.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازێ ژ تە دکەم تو گوهێت من و چاڤێت من و ڕوحا من و لەشێ من و ئەخلاقێ من و مالا من و مرنا من و ژیانا من پیرۆز بکەی، و خێرێت من ژ من قەبویل بکەی. خودێوۆ ئەز خۆ ب تە د پارێزم ژ گرانییا بەلایێ و کەیفخۆشیا دژمنان.

❖ هەی ئەوێ دل و چاڤان وەردگێڕی، دلێ من ل سەر دینێ خۆ موکوم بکە، و دلێ من ل سەر گوهدارییا خۆ موکوم بکە. خودێوۆ ل مە زێدەکە و ل مە کێم نەکە، و مە ب قەدربێخە و مە نەشکێنە، و بدە مە و ل مە ڤەنەگرە و مە ژ چاکان هەلبژێرە ل سەر مە هەلنەبژێرە. خودێوۆ دویماهییا مە د هەمی کاروباراندا باش بکە، و مە ژ شەرمزارییا دنیایێ و ئیزایا ئاخرەتێ بپارێزە.

❖ خودێوۆ هند ترسا خۆ ب ڕزقێ مە بکە، خۆ ژ نەگوهدارییا تە بدەینە پاش، و هند گوهدارییا خۆ ب ڕزقێ مە بکە مە بگەهینیتە بەحەشتا تە، و هند باوەرییا ڕاست و دورست ب ڕزقێ مە بکە ئاتاف و نەخۆشییێت دنیایێ ل سەر مە سڤك بکەت، و مە ب چاڤ و گوهـ و هێزێ خۆش بکە هندی تو مە بهێلییە ساخ، و ڤان دوعایان و ڤان داخوازان بدە وێرسێت مە، و مە ب سەر وی بێخە یێ دژمناهیا مە دکەت، و دنیایێ نەکە مەزنترین خەما مە و نەکە دویماهییا زانینا مە، و نەخۆشییا مە نەکە د دینێ مەدا و کەسێ ب گونەهێت مە ل سەر مە زال نەکە، کو نە ژ تە بترسیت و نە ڕەحمێ و نە دلۆڤانییێ ب مە نەبە.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا ڕاستەڕێیی و تەقوا و پارێزکاری و دەهمەن پاقژی و بێمنەتی و زەنگینییێ ژ تە دکەم.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا هەمی خێر و باشیان ژ تە دکەم، یێت دویر و یێت نێزیك، و یێت ئەز دزانم و یێت ئەز نەزانم، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ هەمی خرابیا یێت دویر و یێت نێزیك، و یێت ئەز دزانم و یێت ئەز نەزانم. و ئەز داخوازا وێ خێرێ ژ تە دکەم یا بەندەیێ تە و پێغەمبەرێ تە (محمد) (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) ژ تە خواستی تو ژێ بپارێزی.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا بەحەشتێ ژ تە دکەم و هەر تشتێ مرۆڤی نێزیکی بەحەشتێ دکەت ژ گۆتن و کریاران، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ جەهنەمێ و هەر تشتێ مرۆڤی نێزیکی وێ دکەت ژ گۆتن و کریاران، و ئەز داخوازێ ژ تە دکەم هەر قەزایەکا تە بۆ من نڤیسی یا خێرێ بیت.

❖ خودێوۆ من ب حەلالێ خۆ ژ حەرامێ خۆ بێ منەت بکە، و من ب کەرەما خۆ ژ غەیری خۆ بێ منەت بکە.

❖ خودێوۆ یا من ل پێشییا خۆ کری، و یا من ب پاش خۆڤە هێلایی، و یا من ب بەرزەییڤە کری و یا من ب ئاشکەرایی کری، و یا تو پێ ژ من ب ئاگەهتر بۆ من بغەفرینە و ژێ ببە، نێ هەر تویی یێ ئێکێ و یێ دویماهییێ، و تو ل سەر هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدار و خودان شیانی.

❖ خودێوۆ د دنیاییێدا باشییێ ب ڕزقێ من بکە، و ل ئاخرەتێ بەحەشتێ ب ڕزقێ من بکە، و من ژ ئیزایا ئاگری بپارێزە.

❖ خودێوۆ هەر تویی خودانێ ئەرد و ئەسمانان و هەر تویی چێکەرێ جن و ئینسانان، وی ب سەربێخە یێ دینێ تە ب سەر بێخیت و هاریکارییا وی بکە یێ هاریکاریا دینێ تە بکەت، وی بن بێخە و بشکێنە یێ دینێ تە بشکێنیت و بەرگەڕیانا شکاندنا دینداران بکەت.

❖ خودێوۆ من بکە ژ وان ئەوێت باوەرییەکا موکوم ب کتێبا تە دئینن، و حەلال و حەرامێ وێ ب جھ دئینن، و ب دورستی ل دویڤ دچن و ل بەر فەرمان و تخویبێت وێ ڕادوەستن، و نەدەنە سەر ئەمر و نەهی و ئەحکامێت وێ.

❖ خودێوۆ ئەز هیڤی دکەم تو دینێ خۆ ب هێز بێخی و عەزیز بکەی، و ئەز ژ وان بم یێت تو دینێ خۆ پێ عەزیز دکەی.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا لێبۆرین و سلامەتییێ بۆ دینێ خۆ و دنیایا خۆ و مالدارییا خۆ ژ تە دکەم. خودێوۆ من د لەش و چاڤ و گوهێت مندا سلامەت بکە.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازێ ژ تە دکەم تو چێترین کار و کریارێت من بێخییە دویماهییا کار و کریارێت من، و چێترین ژییێ من بێخییە دویماهییا ژییێ من، و چێترین ڕۆژێت من بکەیە ئەو ڕۆژا ئەز ل بەر دەستێت تە ڕادوەستم.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا وان ڕێکان ژ تە دکەم یێت ڕەحما تە پێڤە دئێت، و ئەز داخوازا وان تشتان ژ تە دکەم یێت تو پێ خۆش و خێرا مە تێدا، نەهێلی کو نەدەیە مە.

❖ خودێوۆ ئەز داخوازا دلۆڤانییەکێ ژ تە دکەم تو ژ دەڤ خۆ بدەیە من دلێ من پێ دورست بکەی، و کاروبارێت من پێ بگەهینییە ئێك و پرت و بەلاڤان پێ ل من کۆم بکەی، و کێماسیێت من یێت نەدیار پێ دورست بکەی، و کار و کریارێت من یێت ئاشکەرا پێ قەبویل بکەی، و ڕوییێ من پێ سپی بکەی، و من پێ پاقژ بکەی، و من پێ سەرفەراز بکەی و بەلایان پێ ژ من بدەیە پاش، و من ژ هەمی خرابییان پێ بپارێزی.

❖ خودێوۆ تو مە بکە ژ مرۆڤێت خۆ سپارتییە تە (ئانکو خۆ تەسلیمی تە کری)، و دویندەها مە ژی بکە ملەتەکێ خۆ سپارتییە تە، و تۆبەیا مە قەبویل بکە، و ب ڕاستی هەر تویی تۆبەوەرگر و دلۆڤان.

❖ خودێوۆ بێنفرەهییێ ب سەر مەدا دارێژە و مە قاهیم بکە، و پییێت مە موکوم بکە و ڕاگرە، و مە ب سەر گاوران بێخە.

❖ خودێوۆ مە بهیست و مە گوهداری کر، ل مە ببۆرە خودێوۆ، جهێ مە هەر تویی، و دویماهییا مە ئەوە یا ل دەڤ تە.

❖ خودێوۆ ل مە نەگرە ئەگەر مە ژ بیر کر یان ئەم خەلەت بوویین . خودێوۆ بارەکێ هند گران ل مە نەکە وەکی وی یێ تە ل یێت بەری مە کری (کو جوهی بوون)، خودێوۆ وی باری ل مە نەکە یێ ئەم نەشێین ڕاکەین (هلگرین)، و ل مە ببۆرە و گونەهێت مە ژێ ببە، و دلۆڤانییێ ب مە ببە، تو پشتەڤانێ مەیی، و مە ب سەر کۆما گاوران بێخە.

❖ خودێوۆ تو دلێت مە پشتی تە ئەم (د ڕاستا ئایەتێت خۆدا) ڕاستەڕێ کرین، خوار نەکە، و ژ کنارێ خۆڤە دلۆڤانییەکێ ب سەر مەدا دارێژە، ب ڕاستی هەر تویی یێ تێر کەرەم.

❖ خودێوۆ، ب ڕاستی مە باوەری ئینایییە، گونەهێت مە ژێ ببە، و مە ژ ئیزا و نەخۆشییا دۆژەهێ بپارێزە.

❖ خودێوۆ تو ژ نك خۆ دویندەهەکا پاقژ بدە من، ب ڕاستی تویی دوعا وەرگر.

❖ خودێوۆ مە باوەری ب یێ تە ئینایییە خوارێ ئینا، و ئەم ب دویڤ پێغەمبەری کەڤتین و مە ڕێکا وی گرت، ڤێجا تو مە د گەل شاهدان بنڤێسە (شاهدێت باوەرییێ ب تە و کتێب و پێغەمبەرێت تە دئینن، و شادەیییێ بۆ یەکتاییا تە ددەن).

❖ خودێوۆ ل گونەهێت مە و ل زێدەگاڤییا مە ببۆرە، و مە قاهیم بکە (پییێت مە موکوم بکە و ڕابگرە)، و مە ب سەر ملەتێ گاوران بێخە.

❖ خودێوۆ تە ئەڤ جیهانە ژ قەستا چێ نەکرییە، پاکی ژ هەمی کێماسییان هەر بۆ تەیە، و ئەم تە ژ کێماسییان و ژ چێکرنا ژ قەستا و پویچ پاقژ دکەین، خودێوۆ تو مە ژ ئاگرێ دۆژەهێ بپارێزە.

❖ خودێوۆ ب ڕاستی کەسێ تو بکەیە د ئاگریدا، تە ڕسوا و شەرمزار کر، و ستەمکاران چو پشتەڤان و هاریکار نینن.

❖ خودێوۆ ب ڕاستی مە گولێ بوو، بانگهلدێرەك بۆ باوەریئینانێ، یێ گازی دکەت باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەری بینن، ڤێجا مە باوەری ئینا، خودێوۆ ل مە ببۆرە و دانگێ ل سەر گونەهێت مە بگرە (ئانکو ژێ ببە)، و خەلەتی و خرابییێت مە ژێ ببە، و مە د گەل ڤەنجیکاران بمرینە (ئانکو مە ژی ژ وان حسێب بکە، و مە ب هەڤالینیا وان شایی بکە).

❖ خودێوۆ چ پەیمانا تە ل سەر زمانێ پێغەمبەران دایی، بدە مە.

❖ خودێوۆ ڕۆژا قیامەتێ مە ڕسوا و شەمزار نەکە، ب ڕاستی تو ژ سۆزا خۆ لێڤەنابی.

❖ خودێوۆ مە باوەری ب تە ئینا، ڤێجا تو مە ژ شاهدان بنڤێسە، شاهدێت باوەرییێ ب تە و کتێب و پێغەمبەرێت تە دئینن، و شادەییێ بۆ یەکتاییا تە ددەن.

❖ خودێوۆ ب ڕاستی مە خۆ هلپەسارتە تە، و مە پشتا خۆ ب تە موکوم کر، خودێوۆ تو مە ب دەستێت گاور و ستەمکاران جەڕبە نەکەی، و مە نەئێخییە د بن ئیزا و ئەزیەتا وانڤە، کو مە ژ دینێ مە ڤەکەن.

❖ خودێوۆ هەر کاروبارەکێ هەبیت ب ڕەنگەکێ تو پێ ڕازی، من پێ بکە و بکە د ناڤدا، و هەر کاروبارەکێ هەبیت ب ڕەنگێ تو پێ ڕازی من ژێ دەربێخە، و تو ژ دەڤ خۆ من ب هێز بێخە و هاریکارییا من بکە.

❖ خودێوۆ تو دلۆڤانییەکێ ژ دەڤ خۆ ب مە ببە، ل ئاخرەتێ ل مە ببۆرە، و مە ژ نەیاران ئێمن بکە، و ڕزقی ل ڤێ دنیایێ بدە مە، و کارێ مە ڕاست بکە و ب ساناهی بێخە.

❖ خودێوۆ ب ڕاستی ژ بلی تە چو پەرستی نینن، پاکی و پاڤژی ژ هەمی کێماسییان هەر بۆ تەیە، و من ستەمکاری ل خۆ کر.

❖ خودێوۆ تو مە نەئێخە د گەل ستەمکاران.

❖ خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ پالدان و زخاندن و وەسواسا شەیتانان.

❖ خودێوۆ مە باوەری ئینا، ڤێجا ل مە نەگرە، و گونەهێت مە ژێ ببە و دلۆڤانییێ ب مە ببە، و تو چێترین دلۆڤانی.

❖ خودێوۆ گونەهان ژێ ببە و دلۆڤانییێ ب مە ببە و تو چێترین دلۆڤانی.

❖ خودێوۆ تو وان هەڤسەر و وێ دویندەهێ بدە مە، ئەوێت چاڤ پێ ڕۆن ببن و دل پێ ڤەهەسن، و تو مە بۆ پارێزکاران بکە پێشی و جهێ چاڤلێکرنێ د باشییێدا.

❖ خودێوۆ دەستێ من بگرە، ئەز شوکورا تە بکەم ل سەر وان کەرەمێت تە د گەل من و دەیبابێت من کرین، و ئەز وان کار و کاریارێت ڤەنج بکەم ئەوێت تو ژێ ڕازی، و ب دلۆڤانییا خۆ من ژ بەندەیێت خۆ یێت باش حسێب بکە.

- خودێوۆ دلۆڤانی و زانینا تە هەمی تشت یێت ڤەگرتین، ڤێجا گونەهێت وان ئەوێت تۆبەکرین و ڕێکا تە گرتین ژێ ببە، و وان ژ ئاگرێ دۆژەهێ بپارێزە.
- خودێوۆ دەستێ من بگرە و هاریکاری یا من بکە، ئەز شوکورا تە بکەم لە سەر کەرەمێت تە د گەل من و دەیبابێت من کرین، و دەستێ من بگرە و هاریکارییا من بکە ئەز وێ باشییێ بکەم یا تو پێ ڕازی، و دویندەها من بکە دویندەهەکا باش، و من بەرێ خۆ دا تە و ئەز ل بەر ئەمرێ تە یێ ڕاوەستایمە.
- خودێوۆ گونەهێت مە و برایێت مە یێت بەری مە باوەری ئینایین ژێ ببە، و نەڤیانا وان ئەوێت باوەری ئینایین نەئێخە د دلێت مەدا، و مە د ڕاستا واندا زکڕەش نەکە، خودێوۆ تو میهرەبان و دلۆڤانی.
- خودێوۆ مە نەئێخە بەر ئیزایا ستەمکاران، و وان ل سەر مە سەردەست نەکە، کو ب ئیزایەکا ژ تاقەتا مە زێدە مە بجەڕبینی، و ئەو بێژن ئەگەر ئەو یێت هەق بانە، ئەو ب سەرێ وان نەدهات. خودێوۆ تو گونەهێت مە ژێ ببە، نێ ب ڕاستی سەردەست و کاربنەجھ هەر تویی.
- خودێوۆ ڕۆناهییا مە بۆ مە تمام بکە و گونەهێت مە ژێ ببە، ب ڕاستی تو ل سەر هەمی تشتان خودان شیانی.
- خودێوۆ تو گونەهێت من ژێ ببە، و یێت دەیبابێت من، و هەر کەسەکێ بێتە د مالا مندا ژ خودان باوەران، چ ژن چ مێر... و ژ زیانێ و هیلاکێ پێڤەتر نەدە بەر زۆردار و گاوران.
- خودێوۆ ئەز داخوازا سەرفەرازیێ، و ژیانا دلخۆشان و قەدرێ شەهیدان و هەڤالینی و جیرانیا پێغەمبەران و سەرکەڤتنا ل سەر دژمنان ژ تە دکەم ڕۆژا تو حوکمی دکەی.
- خودێوۆ تە گول ئاخڤتنا مە هەیە، و تو من و جهێ من دبینی، و پەنی و نەپەنیا من دزانی، چو ل بەر تە بەرزە نابیت، و ئەز ئەڤ بەندەیێ هەژار و ب لاڤ لاڤ و ب ترس و یێ ئاشکەراکەر بۆ گونەهێت خۆ، ئەز داخوازێ ژ تە دکەم داخوازا ڤەلەندەران، و هەوار دکەمە تە هەوارا گونەهکارێ شکەستی، و ئەز دوعا ژ تە دکەم دوعایا ترسنۆکێ کۆرە، دوعایا وی یێ ستۆیێ وی بۆ تە خواربوویی و لەشێ وی بۆ تە شکەستی و دفنا وی بۆ تە چەمیایی، تو گونەهێت من ژێ ببەی، و خواندنا من ژ من قەبویل بکەی و دوعایێت بۆری هەمییان ژ من قەبویل بکەی، و من و دەیبابێت من و هەمی موسلمانان نەخاسمە ئەوێت خزمەتا دینێ تە دکەن ئازا بکەی و بپارێزی، هەروەکی تو بەندەیێت خۆ یێت باش دپارێزی.

و سلاڤ و سەلەوات ل سەر پێغەمبەرێ تە یێ خۆشتڤی (محمد) بن.

# سوپاسی و ڕێزگرتن

★ دەستپێکێ سوپاسییێت بێ تخویب و هەژی پێشکێشن بۆ مەلبەندێ سێ یێ (یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان) ئەوێ ب سوپاسیڤە هەمی هەوجەیی بۆ من بەردەست کرین، دا بشێم ڤی پرۆژەیێ پیرۆز ب دویماهیك بینم، ب ڕاستی هاریکارەکێ مەزن بوو و پالدەرێ سەرەکی بوو.

★ بۆ هەمی خویشك و برایێت ئەز پالداییم، ب هەر ڕەنگەکێ هەبیت بۆ ڤی پرۆژەیێ پیرۆز.

★ بۆ هەردو سەیدایێت هێژا (إسماعیل طه شاهین و شعبان کەهی) و زەحمەتا وان کێشایی د لێزڤڕینا زمانیدا.

★ بۆ برایێت هاریکاری د وارێ کۆمپیوتەریدا کرین (محمد صادق کۆچەر و مصطفی حجي مەهیدی و محمد عیسی هرۆری).

★ بۆ سەیدایێ من ئەوێ بەردەوام ئەز پالدایمە زانستێت شەرعی سەیدا (خلیل إبراهیم محمد).

★ بۆ هەمی برایێت پشکداری د چاپکرنا ڤێ تەفسیرێدا کرین.

★ دویماهییێ بۆ هەڤسەرا من ئەوا هاریکاری و پشتەڤانییا من کری د چێکرنا ڤێ تەفسیرێدا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهد الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.**

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا (٧٠) يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾.

أَمَّا بَعْدُ فإِنَّ أَصْدَقَ الحديث كِتَابُ اللَّهِ وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ

**قورئان ئەو کەلامێ خودێیە ئەوێ چو ب دەستێ ئەجنا نەمایی، پشتی گولێ بوویی گۆتین:** ﴿ قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا (١) يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلرُّشۡدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦۖ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا ﴾.

**(و ب ڕاستی مە یێ گول قورئانەکا عەجێب بووی، بەرێ مرۆڤی ددەتە ڕاستییێ و مە باوەری پێ ئینا، و ئەم چو شریکان بۆ خودایێ خۆ چێ ناکەین).**

**بێگۆمان خودێ پشتەڤانییا بەندەیێ خۆ و پێغەمبەرێ خۆ (موحەممەد) (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) ب مەزنترین موعجیزە کر، ئەو ژی قورئانە، ئەوا هەر ژ ڕۆژا ئێکێ هاتییە هنارتن و قەبێ ئەجنە و مرۆڤان کری قورئانەکا وەکی ڤێ قورئانێ بینن و نەشیان بینن و خودێ ئەڤ قورئانە کرە ڕاستەڕێکەر و چرایێ ڕاستەڕێییێ، و خەلکی ژ تارستانان دەردئێخیتە بەر ڕۆناهییێ.**

**و موسلمانێت پێشییێ قورئانا پیرۆز خواندن و ژبەرکرن و هزرا خۆ د ڕامان و مەعنا وێدا کرن، و ل بەر ئەمر و بریارێت وێ ڕاوەستیان و خۆ ژ نەهییێت وێ دانە پاش، و دەرس و شیرەتێت وێ یێت بهاگران بۆ خۆ وەرگرتن و کار ب ڕەوشت و سالۆخەتێت وێ یێت بلند کرن** ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾.

**(ئەڤە کتێبەکە مە بۆ تە یا ئینایییە خوار و یا پیرۆزە، دا هزرێت خۆ تێدا بکەن و خودان عەقل بۆ خۆ دەرس و چامەیان ژێ وەرگرن). و موسلمانێت ژێگۆتی قەدر و قیمەتێ هەژی بۆ قۆرئانێ گرتن، ئینا خودێ ژی ئەو ب ڕێز و قەدر ئێخستن و کرنە ڕاستەڕێکەر بۆ خەلکی، و ژ وان ڕازی بوو. و هوین ژی گەلی بەندەیێت خودێ دێ گەهنە وێ سەرفەرازییێ یا ئەو گەهشتینێ، ئەگەر هوین ژی وەکی وان**

سەرەدەرییەکا دورست د گەل قورئانێ بکەن، و قورئانێ بۆ خۆ بکەنە بەرنامە و ڕێبەرێ ژیانا خۆ هەروەکی وان کری.

پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) قورئان یا کرییە ناڤ و نیشانێت باشیێ. بوخاری و موسلم ژ (عثمان)ێ کوڕێ عەففانی ڤەدگێرن، ئەو ژ پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) ڤەدگوهێزیت، دبێژیت: پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆت: (یێ ژ هەوە هەمییان باشتر، ئەوە یێ فێری قورئانێ بووی و ب فێرکرنا وێ ڕادبیت). و موسلمی و ئەبی داوودی و غەیری وان ژی ژ ئەبی هورەیرە ڤەگێڕاییە پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆت: (کۆمەکا مرۆڤان د مالەکێدا ژ مالێت خودێ کۆم نابن و پێکڤە کتێبا خودێ بخوینن و نیشا ئێك و دو بدەن، ئەگەر دلڕەحەتی ب سەر واندا نەئێتە خوارێ و دلۆڤانی ب سەر واندا نەئێتە داڕێتن، و ملیاکەت دۆرماندۆرێت وان نەگرن و خودێ بەحسێ وان ل دەڤ یێت نك خۆ نەکەت).

بەلێ موسلمانێت پێشییێ قەدرێ ڤێ کتێبێ و قەدرێ خواندنا وێ دزانی، ئەڤە ئەبو عەبدولڕەحمانێ سەلەمەیی ئەگەر ئێکی قورئان ل دەڤ خەتمکربایە، دا بەرانبەر خۆ ڕاوەستینیت و دا دەستێ خۆ دانیتە سەر سەرێ وی، و دا بێژیتێ فلان کەس ڤێجا ژ خودێ بترسە و تەقوایا وی بکە، ئەڤرۆ ئەز کەسێ نانیاسم ژ تە چێتر بیت، ئەگەر تو کاری ب وێ بکەی یا تە زانی. موسلم ژ کیس عائیشایێ دبێژیت، پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆت: (یێ شارەزا و ڕەهوان د قورئانێدا یێ د گەل ملیاکەتێت ب ڕێز و قەدر، و ئەوێ قورئانێ دخوینیت و زەحمەتێ ب خواندنا وێڤە دبینیت، وی دو خێر یێت بۆ هەین).

برایێ موسلمان ئەگەر تە بڤێت ب سەر دەرەجەیێت بەحەشتێ بکەڤی، دڤێت تو قورئانێ بخوینی و ژ بەر بکەی، و بەرێ خۆ بدە ڤێ حەدیسێ ئەوا ئەبو داوود ژ عەبدولایێ کوڕێ عومەری ڤەگێرایی، دبێژیت: پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆت: (بۆ خودانێ قورئانێ دێ ئێتە گۆتن: قورئانێ بخوینە هەروەکی تە د دنیایێدا دخواند، و سەرکەڤە تو ل کیرێ ڕاوەستیایی ئەو جهێ تەیە).

بزانە ملەتێ موسلمان ب سەر ناکەڤیت و ناگەهیتە ئارمانجان و ب دورستی ڕزگار نابیت ب ڕێکا ڤێ قورئانێ نەبیت، و ئەگەر ئەو ڕێکا خۆ ل بەر ڕۆناهییا ڤێ قورئانێ و بڕیارێت وێ نەگرن، و ئەگەر ئەو ڕێکا دورست ژ قورئانێ و ڕۆناهییا وێ و سیستەمێ وێ یێ بنەجه نەخوازن.

و یا ئاشکرایە دویڤچۆنا قورئانێ نابیت و نەیا مومکینە، ئەگەر ئەم تێ نەگەهین، و ل سەر شیرەت و دەرسێت وێ ڕانەوەستین و ڕاڤەکرنا وێ نەزانین. و ئەڤ چەندە ب دەست مەڤە نائێت و ب جھ نائێت ب ڕێکا دویڤچۆن و لێگەڕیانێ نەبیت بۆ پەیڤێت قورئانێ کا چ ڕامان و مەعنایێ ددەن، و دبێژنە ڤێ، زانینا تەفسیرێ، ڤێجا تەفسیر کلیلا خزینەیێت قورئانا پیرۆزە، ئەوا هاتی دا جڤاکێت مرۆڤاتی ڕاست و دورست و ب کێرهاتی بکەت، و ستەملێکری و تەپەسەران ڕزگار بکەت. و بێ تەفسیر و زانینا تەفسیرێ ئەم نەشێین بگەهینە وان دوڕ و گەوهەر و خزینەیان.

و ل ڤێرێ نهینیا پاشکەڤتنا موسلمانێت ڤی چەرخی دیاردبیت د گەل هندێ ژی کو دانەیێت قورئانێ زێدە یێت بەرفرەهن و هەژمارا وان یێت قورئان ژ بەر گەلەکن، و پێشییێت مە ڤێ قورئانێ سەرفەرازکرن ب سەرفەرازییەکا مەزن، و بوو جهێ عەجێبییێ بۆ ڕۆناکبیر و زانایێت ڤی چەرخی، د سەر هندێرا کو هەژمارا وان یا کێم بوو و دەست تەنگ بوون، بەلێ وان ڕاست و دورست بەرێ خۆ دا ڤێ قورئانێ و دلێت وان ب قورئانێڤە هاتنە گرێدان، ب ڤی ڕەنگی دوڕ و گەوهەرێت قورئانێ ژی ب دەست وانڤە هاتن. و خەما وان یا ئێکێ ئەو بوو قورئانێ بخوینن و تێ بگەهن و کار پێ بکەن و ب جه بینن بەری ژ بەر بکەن، و پاشی بۆ خۆ بکەنە ڕێك و ڕێباز و پەیاما ژیانێ.

موجاهد دبێژیت: مرۆڤێ ژ هەمییان خۆشڤیتر ل دەڤ خودێ ئەوە یێ شارەزاتر و زاناتر ب وێ یا خودێ ئینایییە خوار. و شەعبی دبێژیت: مەسرووق ژ مەکەهێ چۆ باژێرێ بەسرا ژ بەر تەفسیرا ئایەتەکێ، وەختێ گەهشتییە وێرێ گۆتنێ ئەوێ تە دڤیا و تەفسیرا وێ ئایەتێ دزانی، یێ چۆیە شامێ، ئەو ژی نەچار بوو ژ وێرێ بەرێ خۆ دا شامێ هەتا تەفسیرا وێ ئایەتێ زانی، عەکرمە دبێژیت: ئەز چاردە سالان ل تەفسیرا ڤێ ئایەتێ گەڕیام ﴿ وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾ و من دڤیا بزانم کا ناڤێ وی مرۆڤی چییە، هەتا من زانی ئەو ژی (ضمر)ێ کوڕێ حەبیبییە.

ئبن عەباس خودێ ژێ ڕازی بیت دبێژیت: چەند سالان ئەز مام، من دڤیا ئەز پسیارا عومەرێ کوڕێ خەتابی بکەم کا ئەو هەردو کابانییێت پێغەمبەری کیژك بوون ئەوێت بوویین ە قولپ ل سەر پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن)، و چ ئەز نەدامە پاش ئەز ڤێ پسیارێ زوی ژێ بکەم، سەهما وی تێ نەبیت، ئینا من پسیار ژێ کر، گۆتە من: ئەو حەفسا و عائیشا بوون. ئەها ب ڤی ڕەنگی ئەو یێت ڕژد و هشیار بوون ل سەر تێگەهشتنا قورئانێ و ب ڤی ڕەنگی ل دویڤ دچۆن. بەلێ موسلمانێت ئەڤرۆ کتێبا خودێ یا هێلایی و ئەوێت دخوینن ژی تێ ناگەهن و سەرەدەری یا دورست د گەل ناکەن، و ژ بیرکرن بەرەکەت و خزینەیێت قورئانێ یێت د هندێرا تێ بگەهن، پاشی کار پێ بکەن و ب جه بینن. و خودێ دبێژیت: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾. ئانکو: ئەڤە کتێبەکا پیرۆزە و پڕ خێر و بەرەکەتە، مە یا بۆ تە ئینایییە خوار دا هزرا خۆ د ئایەتێت وێدا بکەن، و دا خودان عەقل بۆ خۆ شیرەت و دەرسان ژێ وەرگرن. و موسلمان ئەڤرۆ وەکی وییە یێ ژ تێناندا دمریت و ئاڤ ل بەر سینگێ وی، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴾، و ئەڤەیە خوسارەتیا ئاشکەرا، قورئان ل بەر دەستێت وان بیت و ئێکا هند نەکەن قورئان وان ب قەدر و قیمەت بێخیت. و دڤێت بزانین دویماهییا ڤێ ئوممەتێ سەرڕاست نابیت ب وێ نەبیت یا دەستپێکا وێ پێ سەرڕاست بوویی، ئەو ژی زڤڕینەکا ڕاست و دورستە بۆ قورئانێ.

زانایێ (سیوطي) ل سەر هەوجەییا تەفسیرێ دبێژیت: قورئان ب ئەزمانێ عەرەبی یێ ئاشکەرا هاتە خوارێ د وەختەکێدا زمانێ عەرەبان یێ دورست بوو و شانازی ب ڕەوانبێژیا خۆ دکرن، د گەل

هندێ ژی تەفسیرا قورئانێ هەمی بۆ وان یا ئاشکەرا نەبوو و هەوجەی پێغەمبەری دبوون، و پسیارا خۆ ب پێغەمبەری دکرن. وەختێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾گۆتن: ما کی هەیە ژ مە ستەم و زولم ل خۆ نەکری. ئینا پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆتە وان: مەخسەد پێ شیرکە و گۆت: خودێ دبێژیت: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾. و ئەم ڤی چەرخی پتر هەوجەی تەفسیرێینە، چونکی ئەم نەخودانێت زمانێ عەرەبینە، و هەتا عەرەب ب خۆ ژی د ڕاستا زمانێ خۆدا وەکی خۆ نەماینە.

ڤێجا ئەگەر خودانێت زمانی یێت شارەزا د زمانیدا هەوجەی تەفسیرێ بن، پا تو چ دبێژی بۆ مە، و ئەم نەخودانێت زمانی، و نە شارەزاییێت زمانی.

## قویناخێت تەفسیرێ

**قویناخا ئێکێ:** دەستپێکێ دڤێت ئەم بزڤرینە قورئانێ ب خۆ بۆ تێگەهشتنا قورئانێ، و دورستترین تەفسیر ئەوە قورئان ب خۆ، خۆ تەفسیر بکەت، و ژ تایبەتمەندییێت ڤێ قورئانێ ئەوە ئەو ب خۆ، خۆ تەفسیر دکەت، هەروەکی زانایێ ناڤدار ئبن تەیمییە دبێژیت: (دورستترین ڕێك د تەفسیرا قورئانێدا ئەوە قورئان ب قورئانێ بێتە تەفسیرکرن وەکی: ﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴾ هەر قورئانێ دیارکر کا (الْمُطَفِّفِينَ) کینە و گۆت: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ﴾ ئانکو: ئەو ئەوێت دەمێ ب پیڤان و کێشان ژ خەلکی دکرن، ب دورستی حەقێ خۆ دخوازن، بەلێ ئەگەر ب کێشان و پیڤان فرۆتن، ترازییێ ددزن.

و وەکی ڤێ ئایەتێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ۝١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴾ ئایەتا د دویڤرا تەفسیرکر و گۆت: ﴿ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴾ ئانکو: ئەو ستێرە یا تارییێ دسومیت و هلدچنیت.

**قویناخا دووێ:** تەفسیرا پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) هەر ژ دەستپێکا هاتنەخوارا وەحییێ هەتا چۆیە بەر دلۆڤانییا خودێ، ب گۆتن و کریارێت خۆ قورئان تەفسیر کر، یان دا حوکمەکی دیارکەت، یان دا بەرسڤا پسیاران دەت یان دا گۆمانەکێ ئاشکراکەت. ئەبی هورەیرە دبێژیت: پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆت: ﴿ ٱلسَّـٰٓئِحُونَ ﴾ڕۆژیگرن. عومەرێ کورێ (خطاب)ی گۆت: پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) د ڕاستا ڤێ ئایەتێدا ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ﴾ گۆت: ئانکو: نڤێژێ بکە، وەختێ ڕۆژ ژ نیڤا ئەسمانی وەردگەریت.

**قویناخا سیێ:** تەفسیرا سەحابیان بۆ قورئانێ: وەختێ سەحابیان، هەوجەیی بۆ تەفسیرێ پتر لێ هات، ئەو ژی ژ بەر چەند ئەگەرەکان:

١. گەلەك ملەتێت دی یێت نەعەرەب هاتنە د موسلمانەتییێدا.

٢. دەستەکێ دی یێ نوی ژ زارۆکێت سەحابیان و غەیری وان پەیدابوون ژیانداری د گەل هاتنەخوارا وەحییێ نەکربوون.

٣. جهێ ئیسلامەتییێ بەرفرەه بوو، و ڕەوشەنبیرییا نوی ئەوا ئەوێت نوی موسلمان بوویین د گەل خۆ ئینایی، د گەل یا ئیسلامێ تێکەل بوو. ڤێ چەندێ هەوجەیی پێدڤی کر ئەو بزڤرنە زانایێت سەحابیان، دا پسیارا تەفسیرێ ژ وان بکەن.

ژ بەر ڤێ چەندێ گەلەك سەحابی ب تەفسیرزانییێ هاتنە نیاسین، و ژ وان و یێت ژ هەمییان ب ناڤ و دەنگتر:

١. عەبدوللایێ کورێ عەباسی ئەوێ پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) دوعا بۆ کرین، و گۆتی: ((یا ڕەبی وی د دینیدا شارەزا بکە، و تەفسیرێ نیشا بدە)).

٢ـ عەبدوللایێ کورێ مەسعوودی، ئەوێ دگۆت: (ئەز ب وی کەم یێ ژ بلی وی چو خودێ نە، سۆرەتەك د قورئانێدا نینە ئەز نەزانم ل کیرێ هاتییە خوارێ، و ئایەتەك د قورئانێدا نینە ئەز نەزانم کا د دەرهەڤێ کێدا هاتییە خوارێ، و ئەگەر من زانیبا ئێکێ دی یێ هەی حێشتر دگەهنێ و ژ من شارەزاترە د کتێبا خودێدا، دا ب سویاری چمە دەڤ).

٣ـ ئوبەیێ کورێ کەعبی یێ ئەنساری، ئەوێ پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) د ڕاستا ویدا گۆتی: (شارەزاترینێ ئوممەتا من د قورئانێدا ئوبەیێ کورێ کەعبییە). و ئەوێ خودێ ئەمرێ پێغەمبەرێ خۆ کری سلاڤان لێ بکەت.

**قویناخا چارێ:** تەفسیرا تابعیان: ژ ناڤ تابعیان گەلەك ناڤ دیاربوون، تەفسیرزان و شارەزا د تەفسیرێدا، نەخاسمە ل مەکەها پیرۆز و ل سەر دەستێ عەبدوللایێ کورێ عەباسی، (سیوطي) ژ ئبن تەیمییە ڤەدگوهێزیت، دبێژیت: خەلکێ ژ هەمییان زاناتر ب تەفسیرێ خەلکێ مەکەهێیە، چونکی ل سەر دەستێ ئبن عەباسی یێت فێربوویین ، وەکی:

١ـ موجاهد، ئەوێ ئێکی وەکی شافعی و بوخاری و سەرێت زانا ئعتیماد ددا سەر، هەتا نەوەوی د دەرهەڤێ ویدا دبێژیت: ئەگەر تەفسیر ژ موجاهدی گەهشتە تە بەسی تەیە (و پسیارا کەسێ دی نەکە).

٢ـ عەتاء

٣ـ سەعید.

٤ـ سوفیانێ سەوری.

٥ـ مەسرووق، زانایێ ناڤدار ئەوێ ل سەر دەستێ ئبن مەسعوودی فێربووی، و ئەوێ شەعبی د دەرهەڤێ ویدا دبێژیت: من کەس نەدیتییە وەکی وی ل دویڤ زانینێ بگەڕیت و بخوازیت.

و پشتی تابعیان گەلەك زانایێت ناڤدار دەرکەڤتن و وان ئەڤ ئەمانەتە تەسلیمی یێت د دویڤ خۆڕا کرن، هەروەکی وان ئەو ئەمانەت ژ یێت بەری خۆ وەرگرتین. و هۆسا دەست بۆ دەستی هەتا دەمەکێ نەگەلەکێ دویر، پاشی ب ڕاستی سستی و بێ خەمی د ڕاستا تەفسیرێدا هاتەکرن، بەلێ خودێ ژ کەرەما خۆ ئەو زانا بۆ موسلمانان پەیداکرن، ڕوحا ڤێ قورئانێ نیشا خەلکی بدەن و بۆ خەلکی دیارکرن کا سەماحەتا ڤی دینی چەندە، و کا چاوا خودێ پشتەڤانییا پێغەمبەرێ خۆ ب ڤێ قورئانا موعجیزە کر، وەکی زانایێ ناڤدار (سید قطب) خودانێ تەفسیرا (في ظلال القرآن) (ل بەر سیبەرا قورئانێ) بۆ مە ئەڤ چەندە باش د تەفسیرا خۆدا دیارکری.

## كورد و تەفسیر

چونكی ملەتێ كورد یێ كەڤنە و خودان شارستانییە و سالۆخەتێت خۆ یێت باش یێت هەین، و ڕەوشتێت وان د جوانن، پڕانیا وان بێ شەڕ موسلمان بوون و هاتنە د ناڤ ئیسلامێدا، و ژ بەر هندێ قوماندار و ناڤدار گەلەك د ناڤ واندا، وەكی (صلاح الدین الأیوبي) ئەوێ قودس ژ خاچپەرێسان پاقژكری، و جارەكا دی سەربلندی و مەزناتیا ئیسلامێ زڤڕاندییەڤە، و تەشجیع و پشتەڤانییا زانینێ كر و هاریكارییا زانایان كر و نێزیكی خۆ كرن.

دیسا گەلەك تەفسیرزانێت ناڤدار د ناڤ كورداندا دەركەڤتن، و د چەرخێت جودا جودادا. ئەڤرۆ تەفسیرێت وان ژێدەرن و كتێبخانەیا ئیسلامی ئەڤرۆ نەشێت پاكییێ پێ نەكەت، ژ وان:

١. شەیخێ ئیسلامێ (ابن تیمیة) خودانێ تەفسیرا (التفسیر الكبیر) دكەڤیتە د شەش بەرگاندا و یا چاپكرییە.

٢. (أبو السعود) یێ ئامێدی خودانێ تەفسیرا (إرشاد العقل السلیم إلى مزایا الكتاب الكریم) دكەڤیتە د پێنج بەرگاندا و یا چاپكرییە.

٣. شێخ مەحموود حەمزە، خودانێ تەفسیرا (در الأسرار) و ئەڤ تەفسیرە ب ڕێنڤیسا كەڤن هاتبوو نڤێسین، یا بێ خال بوو و یا چاپكرییە.

٤. شێخ عبد الكریم هوزان یێ كواشی، خودانێ تەفسیرا (التلخیص في تفسیر القرآن) و د دەه بەرگاندا یا هاتییە چاپكرن.

٥. سەیدایێ مەزن سەعیدێ نوورسی موجاهدێ ب ناڤ و دەنگ، ئەوێ ب جەسارەت بەرانبەر دژمنێت ئیسلامێ ڕاوەستیایی، چەند سۆرەتەك ژ قورئانێ یێت تەفسیركرین ژ وان: تەفسیرا سۆرەتا فاتیحەیێ تەفسیركر، و ئەو د چەپەرێ جیهادێدا بوو بەرانبەر ئویرسی.

٦. سەیدا مەلا خەلیلێ سێرتی.

٧. سەیدا (عبد الكریم المدرس) خودانێ تەفسیرا (مواهب الرحمن في تفسیر القرآن) دكەڤیتە د حەفت بەرگاندا.

٨. شێخ (محمد البالیساني) قورئانا پیرۆز هەمی یا تەفسیركری.

٩. سەیدا (برهان محمد أمین) خودانێ تەفسیرا (ئاسان) هەتا نوكە ب چەند چاپان هاتییە چاپكرن.

١٠. سەیدا (عەلی شیلانی) خودانێ تەفسیرا (رۆناهی).

١١ . سەیدا مەحەمەد سگێری قورئانا پیرۆز هەمی ب درێژی یا تەفسیركری و نەهاتیە چاپكرن.

١٢. سەیدا (عبد الحمید بێزەلی) دەستپێكا قورئانێ یا تەفسیركری هەتا گەهشتییە سۆرەتا تەوبە.

١٣. سەیدا (نظام الدین عبد الحمید) تەفسیرا وی دكەڤیتە د دو بەرگاندا و یا هاتییە چاپكرن.

١٤. سەیدا (تەحسین دۆسكی) و تەفسیرا وی هاتییە چاپكرن.

و گەلەك و گەلەكێت دی.

و سەیدایێ ئیسماعیل سگێری ژی گەهشتە ڤان زانایان ئەوێت خودێ بۆ خزمەتا دینێ خۆ نەرمکرین، و ڤێ خزمەتا مەزن، تەفسیرا قورئانا پیرۆز پێشکێشی ملەتێ خۆ یێ کورد دکەت ب زمانێ وان و خەم ژ هەمی رێك و شێوازێت زمانی یا خواری و ب راستی دێ گەلەك مفای گەهینیتە دەستێ نوی پەیدا دبیت، ئەوێت شارەزایی د زمانێ عەرەبیدا نەی.

و دویماهییێ یا مە پێ چێ بیت بێژینە سەیدایێ ئیسماعیل سگێری ئەڤەیە: خودێ خێرا تە بنڤێسیت، و خەلاتێ زەحمەتا تە بری ب چێکرنا ڤێ تەفسیرێڤە ژ نك خۆ بدەتە تە، و خودێ تە سەرفەراز بکەت کو خزمەتا کتێبا وی یا پیرۆز بکەی، و دیسا دوعا ژ خودایێ مەزن دکەم ڤی کارێ پیرۆز ژ تە قەبویل بکەت و ترازیا کار و کریارێت تە یێت باش پێ گران بکەت، و کتێبا خۆ بۆ مە و بۆ تە بکەتە بەرەڤان و مەهدەر، رۆژا مال و عەیال فایدەی مرۆڤی نەکەن، ئەو نەبیت مرۆڤ ب دلەکێ ساخلەمڤە بچیتە دەڤ خودێ، ب راستی ئەو خۆش پشتەڤان و هاریکارە.

**زاهد أسعد محمد**
**ئیمام و خوتبەخوینێ مزگەفتا شەهیدان**
**و راگرێ بەرێ یێ کۆلیجا شەریعەتی**
**١٤٢١/١١/٢٩ بەرامبەر ٢٠٠١/٢/٢**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشگۆتن

**الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وبعد:**

**بێگۆمان قەدر و بهایێ هەر زانینەکا هەبیت ب بابەت و ناڤەرۆکا وێڤە یا گرێدایییە، و چونکی تەفسیر یا ب قورئانێڤە گرێداییە پیرۆزترین زانین دئێتە هەژمارتن، و هەر ژ بەر هندێ ژ مێژەوەرە و هێژ ئەز ل قویناخا ئامادەیی بووم من حەژ تەفسیرێ دکر، و من بۆ خۆ دگۆت ئەگەر ئەز شیابامە من تەفسیرەکا کورت و ب ئەزمانێ کوردی ئامادەکربایە، و ل دەستپێکا خواندنا زانکۆیێ من ب ئەرك و واجب دیت ئەز خەما تەفسیرەکا کوردی بخۆم، و من خواندنا خۆ بۆ زمانێ کوردی و نڤێسینا کوردی زێدەکر و من دەست ب نڤێسینێ کر بۆ ڕۆژنامەیێت وی وەختی، هەر ژ بۆ ڤێ مەرەمێ، و سالا (١٩٨٦)ێ من دەست ب خواندنا تەفسیران کر و چەند تەفسیرەك وەکی: (ابن کثیر) و (تفسیر الواضح) و (صفوة التفاسیر) و (تفسیر المراغي...) و سالا (١٩٩٢)ێ ب ڕەنگەکێ ل کار من دەست ب تەفسیرێ کر، و دەستپێکێ من دەست هاڤێتە تەفسیرا جزی عەممایێ، و پشتی دەمەکی من چاپکر، و پاشی جوزئێ تەبارەکێ ژی من ب دویماهی ئینا، پاشی جارەکا دی ئەز زڤڕیمە سەرێ قورئانێ و سۆرەتا فاتیحە و بەقەرە. و سەیدایێ ئیسماعیل تاها شاهین هەر د گەل من بوو پشتی من تەفسیرا چەند ئایەتان دکر ئەو لێ دزڤڕی و چاڤدێرییا زمانی ل سەر دکر، و پشتی وی دورست دکر ژ نوی جارەکا دی دا نڤێسمەڤە، و هۆسا ئەم پێکڤە چۆین ئەم گەهشتینە دەستپێکا سۆرەتا نیساء، و ژ بەر مژویلیا وی ئەم د گەل سەیدایێ شەعبان کەهی پێك هاتین ب کارێ سەیدایێ ئیسماعیل تاها شاهین ڕابیت، و هۆسا ئەو د گەل من ما بۆ چاڤدێرییا زمانی هەتا تەفسیر تمام بووی، پشتی تمام بووی و چۆیە د کۆمپیوتەریدا. جارەکا دی ئەم لێ زڤڕینەڤە و لجنەیەکا سێ قۆلی مە چێکر، ژ من و سەیدایێ ئیسماعیل تاها و شەعبان کەهی، و قورئان د دەستێ مەدا بوو، و ئایەت ئایەت جارەکا دی ئەم لێ زڤڕینەڤە و ڤی کاری دەمەکێ درێژ کێشا سالەکا دەراندەر، چونکی ئەم گەلەك هویرك و ل سەر خۆ لێ دزڤڕین، و ئەم هینگێ ژ ئایەتێ دبۆرین هەتا ئەم ژ تەفسیرا وێ ڕازی د بوویین.**

**و بۆ ڤێ لێزڤڕینێ گەلەك جاران ئەم جارەکا دی ل ژێدەرێت خۆ دزڤڕینەڤە، و بۆ ڤێ تەفسیرێ مفا ژ کۆمەکا تەفسیران هاتییە وەرگرتن، بەلێ بۆ ئختیلافێ باراپتر ئەز دزڤڕیمە تەفسیرا (ابن کثیر)، و هەر ئەو یا سەرەکی بوو بۆ تەفسیرا ئەسماء و سیفاتان و کا پێشییێت پاك و پاقژ چاوا تەفسیر کرینە من ژی وەسا یێت تەفسیرکرین. و من چو ئایەت تەفسیر نەکرینە ئەگەر من د هەمی تەفسیرێت ل بەر دەستێ خۆدا نەخواندبن و گەلەك جاران دو سەعەتان یان پتر ئەز یێ مایمە ب تەفسیرا ئایەتەکێ ب تنێڤە، و وەختێ من بۆ تەفسیرێ، بارا پتر پشتی نڤێژا سپێدێ و پشتی نڤێژا عەیشا بوو، چونکی من**

گەلەك كاروبارێت دی هەبوون ئەو ژی دهاتنە كرن، و تەفسیر ژی یا بەردەوام بوو هەتا سالا ڕۆژ غەیری (ڕۆژا چارشەنبی ڕێكەفتی ٢٠٠٠/٨/١١).

خەلك مژویلی بەرێخۆدانا ڕۆژێ و دیمەنێ وێ یێ عنتیكە بوو، و ئەز مژویلی تەفسیرێ بووم و من تەفسیر چێ دكر.

ئارمانجا من ژ دانانا ڤێ تەفسیرێ ئەڤە بوو: ئێك ئەز خزمەتەكێ بۆ ملەتێ خۆ پێشكێش بكەم و قورئانا پیرۆز ب زمانێ كوردی تەفسیر بكەم، و د گەل قورئانێ چاپ بكەم، دا هەرگاڤا ئێكی ژ مە قورئان خواند و ئایەتەكێ تێ نەگەهشت بزڤڕیتە تەفسیرێ ب زمانێ كوردی، و دیسا من ڤیایە ببیتە ژێدەرەك بۆ زمانێ كوردی و پەیڤێت كوردی، ژ بەر هندێ من وەختەكێ درێژ و ب بها د گەل هەردو سەیدایێت شارەزا د زمانێ كوردیدا: سەیدا ئیسماعیل تاها شاهین و سەیدا شەعبان كەهی بۆراند، خودێ خێرا وان بنڤێسیت و ڤی كاری بۆ وان سەدەقەیا جاری حسێب بكەت.

هیڤییا من ئەوە هەر برایەكی تێبینییەك ل سەر تەفسیرێ هەبیت ب دلسۆژی و ب نڤێسین بگەهینیتە من، دا مفا ژێ بێتە وەرگرتن بۆ چاپێت پاشتر، و دویماهییێ ئەز دوعایێ ژ خودێ دكەم ڤی كاری ژ من قەبویل بكەت و بۆ خۆ حسێب بكەت، و گونەهێت من و دەیبابێت من ژێ ببەت و ڤی كاری بكەتە د ترازیا من و دەیبابێت مندا.

**دكتور: ئیسماعیل سگێری**

**٢٨/ ذي الحجة/ ١٤٢١**

**٢٣ / ئادار/ ٢٠٠١**

**ڕۆژا ئەینی / ل ( مەدینە )یێ**

**مزگەفتا پێغەمبەری ( سلاڤێت خودێ ل سەر بن )**

## تەفسیرا ژیان د چەند ڕێزەکاندا

١. (تەفسیرا ژیان) ئەڤ ناڤە ژ ڤێ ئایەتا پیرۆز هاتییە وەرگرتن ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ﴾، خودایێ مەزن ئەڤ قورئانە ب جان و ژیانێ دا نیاسین و دڤێت قورئان ژیانا مە بیت، و دا قورئان ببیتە ژیانا مە، دڤێت ئەم تێ بگەهین و ڕێکا ڤێ تێگەهشتنێ تەفسیرە، و ژ بەر هندێ هەر من ناڤێ ژیانێ دانا سەر چونکی ڕێکە بۆ ژیانێ.

٢. هەر ژ سالا (١٩٩٢)ێ من دەست هاڤێتییە ڤێ تەفسیرێ و سالا (٢٠٠١)ێ یا ب دویماهی هاتی، و ئەگەرێ ڤێ گیرۆبوونێ ئەو بوو من د سەر کاروباڕێت خۆڕا یا چێکری، باراپتر من پشتی نڤێژا سپێدێ و نڤێژا عەیشا یا چێکری چونکی من گەلەك شۆلێت دی هەبوون.

٣. هەتا ئەز نەزڤڕیبامە هەمی تەفسیرێت ل بەر دەستێ خۆ، من تەفسیرا چو ئایەتان بنەجه (تەسبیت) نەدکر.

٤. پشتی تەفسیر ب دویماهی هاتی، ئەز سالەکێ دورست ئایەت ئایەت د گەل سەیدایێ (اسماعیل طه شاهین) و سەیدایێ شەعبان کەهی یێ لێ زڤڕیم، و ب ڕاستی هەردووکان گەلەك یا خۆ ب ڤێ تەفسیرێڤە وەستاندی، نەخاسمە سەیدایێ (اسماعیل طه شاهین)، خودێ خێرا هەردووکان بنڤێسیت، سەرپەرشتیا زمانی و لێزڤڕینا زمانی و ڕێنڤیس، وان یا کری.

٥. هەمی شێوازێت زمانی د ڤێ تەفسیرا کوردیدا ب خەم پێت هاتینە وەرگرتن، ژ پیتێت سویندێ بگرە هەتا دگەهییە شێوازێت تەئکیدێ.

٦. ئارمانجا سەرەکی ژ ڤێ تەفسیرێ ئەوە، تەفسیرا ئایەت ئایەت بکەت بێی تەفسیرا ئایەتێ ب درێژی بگریت، یان ئەگەرێت هاتنە خوارا ئایەتان بێژیت، ژ بەر ڤێ چەندێ من درێژ نەکر، و هیڤییا من ئەوە ڤێ تەفسیرێ شیابیت ئارمانجا خۆ ب جه بینیت.

٧. ب ڤی ڕەنگی کار دهاتە دورستکرن، پاشی د کۆمپیوتەریدا، ئەز و سەیدایێ (اسماعیل طه شاهین) لێ دزڤڕینەڤە، پاشی جارەکا دی ل سەر کۆمپیوتەری دهاتە دورستکرن، پاشی سەیدایێ شەعبان کەهی لێ دزڤڕیڤە، پشتی هنگی دهاتە نەخشەکێشکرن و جارەکا دی ئەز بۆ جارا دویماهییێ لێ دزڤڕیمەڤە.

٨. هندی من شیای من نەڤیایە تەفسیر درێژ ببیت، دا بشێین تەفسیرا هەر بەرپەڕەکی بکەینە فەرۆزا وی بەرپەڕی، دا لێ زڤڕینا تەفسیرا ئایەتێ د گەل خواندنا قورئانێ یا ب ساناهی بیت، و هەر بۆ ڤێ مەرەمێ ژی مە خەتێ قورئانێ مەزنکرییە و مە تەفسیرا چو بەرپەڕان نەبرییە د بەرپەڕەکێ دی یێ قورئانێدا.

٩. دبیت هندەك جاران باش تەفسیرا ئایەتێ یا دیار نەبیت، و پێدڤی ب ڕۆنکرنێ بیت و ئەو زێدەڕۆنکرنە نە ژ ئایەتێ ب خۆ بیت، بەلێ ژ بۆ ڕۆنکرنا تەفسیرا ئایەتێ مە ئەو زێدەڕۆنکرن یا ئینایی و یا کرییە د ناڤبەرا دو کڤانێت ب کوژی دا [ ﴾و ئەگەر یا د ناڤبەرا ڤان کڤاناندا نەئێتە

خواندن ژی، تەفسیر خەلەت نابیت. و ئەگەر دو پەیڤ ب ئێك ڕامان هاتبن ئێك ژ وان من یا کرییە د ناڤبەرا دو کڤانێت ئاساییدا ( ).

١٠- هندی من شیایی من زاراڤێ دەڤەرا دهۆکێ ب کارئینایییە د تەفسیرێدا نەخاسمە د ئاوایێ کۆمێدا.

١١- ئەگەر ئایەت ژ ئێك ڕامانێ پتر بدەت و هەر تەفسیرەکێ ڕامانەك گرتبیت، و چێدبیت مەخسەدا ئایەتێ هەمی ڕامان بن، من هەمی یێت ئینایین. و ئایەتا هەر تەفسیرەك ب ڕەنگەکێ تەفسیر بکەت و چێ نەبیت ئەڤ تەفسیرە ژ بۆ ئێك ئایەتێ کۆم ببن چونکی نەوەکی ئێکن. و دڤێت ئێك بێتە ژێگرتن، ژێدەرێ سەرەکی بۆ چارەسەرکرنا ڤێ ئێکێ ئەڤ تەفسیرە بوون: تەفسیرا (ابن کثیر) و تەفسیرا (شوکاني).

١٢- ل دۆر تەفسیرا ناڤ و سالۆخەتان (أسماء وصفات) ژێدەرێ سەرەکی تەفسیرا (ابن کثیر)ـە، و بۆ ڤێ چەندێ ئەز دزڤڕیمە تەفسیرا ناڤبری، و من وەکی وێ یێت تەفسیرکرین.

١٣- بۆ ڤێ تەفسیرێ، مفا ژ ڤان ژێدەران هاتییە وەرگرتن: (تفسیر ابن کثیر، مختصر تفسیر الطبري، تفسیر القرطبي، زبدة التفسیر، صفوة البیان، صفوة التفسیر، تفسیر النسفي، مفردات القرآن للأصفهاني، تفسیر مفردات القرآن، المصحف المفسر لمحمد فرید وجدي، تفسیر المراغي)، و تەفسیرێت کوردی: (تەفسیرا ئاسان، تەفسیرا هەژار، تەفسیرا مامۆستا محمد صالح ئیبراهیم).

| سۆرەت | ژمارا وێ | بەرپەر | مەکییە یان مەدەنی | سۆرەت | ژمارا وێ | بەرپەر | مەکییە یان مەدەنی | سۆرەت | ژمارا وێ | بەرپەر | مەکییە یان مەدەنی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| فاتیحە | ١ | ١ | مەکییە | زومەر | ٣٩ | ٤٥٨ | مەکییە | مورسەلات | ٧٧ | ٥٨٠ | مەکییە |
| بەقەرە | ٢ | ٢ | مەدەنییە | غافر | ٤٠ | ٤٦٧ | مەکییە | نەبەء | ٧٨ | ٥٨٢ | مەکییە |
| ئالیعومران | ٣ | ٥٠ | مەدەنییە | فصلت | ٤١ | ٤٧٧ | مەکییە | نازیعات | ٧٩ | ٥٨٣ | مەکییە |
| نساء | ٤ | ٧٧ | مەدەنییە | شوورا | ٤٢ | ٤٨٣ | مەکییە | عەبەسە | ٨٠ | ٥٨٥ | مەکییە |
| مائیدە | ٥ | ١٠٦ | مەدەنییە | زوخروف | ٤٣ | ٤٨٩ | مەکییە | تەکویر | ٨١ | ٥٨٦ | مەکییە |
| ئەنعام | ٦ | ١٢٨ | مەکییە | دوخان | ٤٤ | ٤٩٦ | مەکییە | انفطار | ٨٢ | ٥٨٧ | مەکییە |
| ئەعراف | ٧ | ١٥١ | مەکییە | جاثیة | ٤٥ | ٤٩٩ | مەکییە | مطففین | ٨٣ | ٥٨٧ | مەکییە |
| ئەنفال | ٨ | ١٧٧ | مەدەنییە | ئەحقاف | ٤٦ | ٥٠٢ | مەکییە | ئنشیقاق | ٨٤ | ٥٨٩ | مەکییە |
| تەوبە | ٩ | ١٨٧ | مەدەنییە | موحەمەد | ٤٧ | ٥٠٧ | مەدەنییە | بروج | ٨٥ | ٥٩٠ | مەکییە |
| یوونس | ١٠ | ٢٠٨ | مەکییە | فەتح | ٤٨ | ٥١١ | مەدەنییە | طارق | ٨٦ | ٥٩١ | مەکییە |
| هوود | ١١ | ٢٢١ | مەکییە | حوجورات | ٤٩ | ٥١٥ | مەدەنییە | ئەعلا | ٨٧ | ٥٩١ | مەکییە |
| یووسف | ١٢ | ٢٣٥ | مەکییە | قاف | ٥٠ | ٥١٨ | مەکییە | غاشیە | ٨٨ | ٥٩٢ | مەکییە |
| رەعەد | ١٣ | ٢٤٩ | مەدەنییە | ذاریات | ٥١ | ٥٢٠ | مەکییە | فەجر | ٨٩ | ٥٩٣ | مەکییە |
| ئیبراهیم | ١٤ | ٢٥٥ | مەکییە | طور | ٥٢ | ٥٢٣ | مەکییە | بەلەد | ٩٠ | ٥٩٤ | مەکییە |
| حیجر | ١٥ | ٢٦٢ | مەکییە | نەجم | ٥٣ | ٥٢٦ | مەکییە | شەمس | ٩١ | ٥٩٥ | مەکییە |
| نەحل | ١٦ | ٢٦٧ | مەکییە | قەمەر | ٥٤ | ٥٢٨ | مەکییە | لەیل | ٩٢ | ٥٩٥ | مەکییە |
| ئیسراء | ١٧ | ٢٨٢ | مەکییە | رەحمان | ٥٥ | ٥٣١ | مەکییە | ضحی | ٩٣ | ٥٩٦ | مەکییە |
| کەهف | ١٨ | ٢٩٣ | مەکییە | واقیعە | ٥٦ | ٥٣٤ | مەکییە | شەرح | ٩٤ | ٥٩٦ | مەکییە |
| مەریەم | ١٩ | ٣٠٥ | مەکییە | حەدید | ٥٧ | ٥٣٧ | مەدەنییە | تین | ٩٥ | ٥٩٧ | مەکییە |
| طه | ٢٠ | ٣١٢ | مەکییە | موجادیلە | ٥٨ | ٥٤٢ | مەدەنییە | عەلەق | ٩٦ | ٥٩٧ | مەکییە |
| ئەنبیاء | ٢١ | ٣٢٢ | مەکییە | حەشر | ٥٩ | ٥٤٥ | مەدەنییە | قەدر | ٩٧ | ٥٩٨ | مەکییە |

| حەج | ٢٢ | ٣٣٢ | مەدەنییە | مومتەحینە | ٦٠ | ٥٤٨ | مەدەنییە | بەیینە | ٩٨ | ٥٩٨ | مەدەنییە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| موئمینوون | ٢٣ | ٣٤٢ | مەکییە | صف | ٦١ | ٥٥١ | مەدەنییە | زەلزەلە | ٩٩ | ٥٩٩ | مەدەنییە |
| نوور | ٢٤ | ٣٥٠ | مەدەنییە | جوموعە | ٦٢ | ٥٥٣ | مەدەنییە | عادییات | ١٠٠ | ٥٩٩ | مەکییە |
| فورقان | ٢٥ | ٣٥٩ | مەکییە | مونافیقون | ٦٣ | ٥٥٤ | مەدەنییە | قاریعە | ١٠١ | ٦٠٠ | مەکییە |
| شوعەراء | ٢٦ | ٣٦٧ | مەکییە | تەغابون | ٦٤ | ٥٥٦ | مەدەنییە | تکاثر | ١٠٢ | ٦٠٠ | مەکییە |
| نەمل | ٢٧ | ٣٧٧ | مەکییە | طلاق | ٦٥ | ٥٥٨ | مەدەنییە | عصر | ١٠٣ | ٦٠١ | مەکییە |
| قصص | ٢٨ | ٣٨٥ | مەکییە | تەحریم | ٦٦ | ٥٦٠ | مەدەنییە | هومەزە | ١٠٤ | ٦٠١ | مەکییە |
| عەنکەبووت | ٢٩ | ٣٩٦ | مەکییە | مولك | ٦٧ | ٥٦٢ | مەکییە | فیل | ١٠٥ | ٦٠١ | مەکییە |
| رووم | ٣٠ | ٤٠٤ | مەکییە | قەلەم | ٦٨ | ٥٦٤ | مەکییە | قورەیش | ١٠٦ | ٦٠٢ | مەکییە |
| لوقمان | ٣١ | ٤١١ | مەکییە | ئەلحاقە | ٦٩ | ٥٦٦ | مەکییە | ماعوون | ١٠٧ | ٦٠٢ | مەکییە |
| سەجدە | ٣٢ | ٤١٥ | مەکییە | مەعارج | ٧٠ | ٥٦٨ | مەکییە | کوثر | ١٠٨ | ٦٠٢ | مەکییە |
| ئەحزاب | ٣٣ | ٤١٨ | مەدەنییە | نووح | ٧١ | ٥٧٠ | مەکییە | کافیروون | ١٠٩ | ٦٠٣ | مەکییە |
| سەبەء | ٣٤ | ٤٢٨ | مەکییە | جن | ٧٢ | ٥٧٢ | مەکییە | نصر | ١١٠ | ٦٠٣ | مەنییە |
| فاطر | ٣٥ | ٤٣٤ | مەکییە | موززەمل | ٧٣ | ٥٧٤ | مەکییە | مەسەد | ١١١ | ٦٠٣ | مەکییە |
| یاسین | ٣٦ | ٤٤٠ | مەکییە | مدثر | ٧٤ | ٥٧٥ | مەکییە | إخلاص | ١١٢ | ٦٠٤ | مەکییە |
| صافات | ٣٧ | ٤٤٦ | مەکییە | ئەلقیامە | ٧٥ | ٥٧٧ | مەکییە | فەلەق | ١١٣ | ٦٠٤ | مەکییە |
| صاد | ٣٨ | ٤٥٣ | مەکییە | ئینسان | ٧٦ | ٥٧٨ | مەدەنییە | ناس | ١١٤ | ٦٠٤ | مەکییە |

ـم نیشانا ڕاوەستیانا پێدڤییە، وەکی ڤێ ئایەتێ ﴿ ۞ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَالْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾ دڤێت ل سەر پەیڤا (يَسْمَعُونَ) ڕاوەستیان هەبیت.

لا نیشانا نەڕاوەستیانێیە. وەکی: ﴿ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾.

صلى نیشانا هندێیە نەڕاوەستیان باشترە، د گەل دورستیا ڕاوەستیانێ، وەکی: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾.

قلى نیشانا هندێیە ڕاوەستیان باشترە، وەکی: ﴿ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَاءً ظَاهِرًا ﴾

ج نیشانا دورستیا ڕاوەستیانێیە، و ڕاوەستیان و نەڕاوەستیان وەکی ئێکە، وەکی: ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴾.

∴ ∴ نیشانا هندێیە، دورستە ل جهەکی ڕاوەستیان هەبیت، نە ل هەردو جهان، وەکی: ﴿ ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾

٥ نیشانا حەرفا زێدەیە و نائێتە خواندن، وەکی: ﴿ أُولَٰئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ ﴾، ﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾،

ο نیشانا زێدەیا پیتێیە ئەگەر بێتە لێکدان، و نائێتە خواندن، وەکی ﴿ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ ﴾، ﴿ لَّٰكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾.

ـه نیشانا ساکنیا حەرفێیە، وەکی: ﴿ قَدْ سَمِعَ ﴾، ﴿ أَوَعَظْتَ ﴾.

م نیشانە ل سەر (ئیقلابێ) ئانکو: وەرگێڕانا پیتێ، وەکی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾، ﴿ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾، ﴿ فَكَانَتْ هَبَاءً مُّنبَثًّا ﴾.

ٌ ً ٍ نیشانە ل سەر دیارەکرنا تەنوینێ، وەکی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا (٢٤) إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴾، ﴿ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ (٧) ﴾.

ٌّ ًّ ٍّ نیشانە ل سەر ئیدغامێ (پیتێ بکەیە د ناڤ پیتێدا) یان نەئاشکراکرنا تەنوینێ ﴿ اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴾.

ا ، و ، ن نیشانە ل سەر وێ چەندێ کو دڤێت ئەو پیتێت هاتینە هێلان بێنە خواندن، وەکی: ﴿ ذَٰلِكَ الْكِتَابُ ﴾، ﴿ يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم ﴾، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ ﴾.

س نیشانە ل سەر پێدڤیا خواندنا (س) شوینا (ص) ئەڤە ئەگەر (س) ل سەر پیتا (ص) هاتە دانان. وەکی: ﴿ وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُطُ ﴾، و ئەگەر پیتا (س) ل بن پیتا (ص) هاتە دانان، هنگی صاد بێتە خواندن بەلاڤترە، وەکی: ﴿ الْمُصَيْطِرُونَ ﴾.

~ نیشانە ل سەر مەددا (کێشانا) درێژ وەکی: ﴿ سِيءَ بِهِمْ ﴾، ﴿ الم ﴾، ﴿ الطَّامَّةُ ﴾، ﴿ شُفَعَاءَ ﴾.

۞ نیشانە ل سەر دەستپێکا جوزئا و ئەحزابا و چارێك و نیڤ و سێکا وان.

○ نیشانە ل سەر دویماهییا ئایەتێ و هەژمارا وێ.

۩ نیشانە ل سەر جهێ سوجدەیێ، و پێدڤیا وێ، وەکی: ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ وَالْمَلَائِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ (٤٩) يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۩ ﴾